# صەلات.. گرێ کوێرەکەی بەناو قورئانیەکان

**نوسینی: ئەیاد ئەحمەد**

بەناو قورئانیەکان ئەوانەی تەواوی فەرمووده رەتدەکەنەوەو بانگەشەی ئیکتیفاکردن بە قورئان دەکەن گەورەترین کێشەیان بریتیە لە بابەتی صەلات و ئەو ئایەتانەی وشەی صەلاتی تیادا هاتووە لە قورئاندا.

دەتوانین بڵێین ئەوان لە بابەتی صەلات بوون بە سێ گروپ:

گروپی یەکەمیان دەڵێن صەلات بەمانای نوێژ دێ بەڵام ئێمە نوێژ لە رێی فەرموودەوە فێرنەبووین بەڵکو بە تەواتوری عەمەلی و لە باوك و باپیرانمانەوە بە شێوەیەکی کردەیی فێربووین، ئەوانە زۆریش جەخت لەوە دەکەنەوە کە لە هیچ فەرموودەیەکی زارەکی نەهاتووە بە تەفسیلی باسی نوێژ و رکاتەکانی و کاتەکانی بکا لەبەر ئەوەی پەرستشێکی کردەییە و جیل دوای جیل بۆمان گوازراوەتەوە و پێش نوسینەوەی کتێبەکانی فەرموودە نوێژ هەر هەبووە.

گروپی دووەم دەڵێن صەلات بەمانای نوێژ دێ بەڵام نەك بەو شێوەیەی ئەمڕۆ و ئەو پێنج نوێژەی ئەهلی سوننە دەیکەن، بەڵکو رۆژانە دوو هەندێکیشیان دەڵێن سێ نوێژە و تەنها قورئان خوێندنە و رکوعی تیانیە.

گروپی سێیەم دەڵێن صەلات ئەصڵەن بەمانای نوێژ نایەت بەڵکو وشەی (صلاة) لە وشەی (صلة) هاتووە واتا پەیوەندی، واتا صەلاتکردن ئەوەیە تۆ پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆت ببەستی بە کاری چاکە و یارمەتیدانی خەڵك نەك ئەو حەرەکاتەی ئەمڕۆ ئەهلی سوننە دەیکەن.

## وەڵامی گروپی یەکەم:

لە وەڵامی گروپی یەکەمدا کە دەڵێن ئێمە نوێژ بە تەواتوری کردەیی و لە باوك و باپیرانمانەوە فێربووین ئەوانیش لە پێش خۆیان تادەگاتەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ).. تەنها ئەوەندە بەسە بڵێین کە بانگەشەیەکەیان بە ئیکتیفاکردن بە قورئان و پێویست نەبوون بە هیچ شتێکی تر لە دەرەوەی قورئان هەڵوەشایەوە چونکە بە دانپیانانی خۆیان نوێژ لە دەرەوەی قورئان فێربوون ئینجا با ئەوان هەر ناوی بنێن تەواتوری عەمەلی و باوك و باپیران، کەواتە زۆر بە سادەیی دەگەینە ئەو ئەنجامەی تەنها قورئان کافی نیە بۆ دین لەبەر ئەوەی پەرستشێکی گرنگی وەك نوێژ لە دەرەوەی قورئان فێربووین.

جا ئەوەی ئەوان ناوی لێدەنێن تەواتوری عەمەلی و زمانیان ناگری بڵێن فەرموودە هەر بەشێکە لە فەرموودە، لەبەر ئەوەی زانایان لە پێناسەی فەرموودەدا وتویانە هەر شتێکە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لە وتە یان کردەوە یان ئیقرار، کەواتە نوێژ کە هاوەڵان بە کردەیی لە پێغەمبەریان بینیوە گێڕایتیانەوە هەر فەرموودەیە بەڵام فەرموودەی کردەیی.

ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبەکانی فەرمووودەشدا ژمارەی نوێژەکان و رکاتەکان و کاتەکانی هاتووە، هەندێکیان بە روونی پێغەمبەر خۆی دیاریان دەکا هەندێکیش هاوەڵان لە پێغەمبەریان بینیوەو دەیگێرنەوە کە بەو شێوەیە نوێژی کردووە، ئەوەش جێبەجێکردنێکە بۆ فەرمووودەی زارەکی «صلوا کما رأیتمونی أصلي» البخاري٦٣١ واتا نوێژ بکەن وەك چۆن منتان بینی نوێژ دەکەم.

سەبارەت بە ژمارەی نوێژەکان فەرموودەی ئەو پیاوە دەشتەکیەی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری دەربارەی ئیسلام لێکرد و چی لەسەر فەرزە، کە فەرموودەکە بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، لە وەڵامدا پێغەمبەر یەکەم شت پێی دەڵێ: «خمس صلوات فی الیوم واللیلة» واتا پێنج نوێژ لە شەو و رۆژێکدا.

سەبارەت بە کاتەکان لە صەحیحی موسلیمدا (بە ژمارە ٦١٣) هاتووە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری کاتەکانی نوێژی لێکرد، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو لەگەڵمان نوێژ بکە، ئینجا کە کۆتا تاریکی شەو دادێ فەرمان بە بیلال دەکا بانگبدا بۆ نوێژی بەیانی و کە رۆژ لەناوەندی ئاسمان دێتە خوارەوە ئەمری پێدەکا بانگبدا بۆ نیوەڕۆ پاشان ئەمری پێدەکا بانگ بدا بۆ عەسر کە رۆژ بەرز دەبێتەوە لە ئاسمان پاشان ئەمری پێدەکا بانگبدا بۆ مەغریب کاتێك رۆژ ئاوا دەبێ پاشان عیشا کاتێك سوراتی ئاسمان بزر بوو.

سەبارەت بە رکاتەکان بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پیاوێك دەبینێ دوای نوێژی بەیانی نوێژ دەکا بۆیە پێ دەفەرموێ «صلاه الصبح رکعتان» أبو داود (١٢٦٧) واتا نوێژی بەیانی دوو رکاتە.

سەبارەت بە نوێژەکانی تر دایکە عائیشە (خوا لێی رازی بێ) دەفەرموێ: «کان أول ما افترض علی رسول الله صلی الله علیه وسلم الصلاة: رکعتان رکعتان، إلا المغرب، فإنها کانت ثلاثا، ثم أتم الله الظهر والعصر والعشاء الآخرة أربعا في الحضر، وأقر الصلاة علی فرضها الاول في السفر» مسند أحمد (٢٦٣٣٨) واتا سەرەتا کە نوێژ فەرز کرا دوو رکات بوو تەنها مەغریب نەبێ سێ رکات بوو پاشان خوای گەورە نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسر و عیشای کردە چوار رکات و لەسەفەردا هەر لەسەر دوو رکاتەکە مایەوە.

ئەمە بێجگە لەوەی چەندین فەرموودەی ترمان هەیە کە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) روونەکاتەوە و لە جوڵەکانی نوێژدا چی وتووە و چ ئایەتێکی خوێندووە و چ زیکرێکی کردووە.

## وەڵامی گروپی دووەم:

لە وەڵامی گروپی دووەم کە دەڵێن رۆژانە تەنها دوو یان سێ نوێژ هەیە، جارێ تا ئێستا ئەوان کۆك نین لەسەر ژمارەو چۆنیەتی ئەو نوێژە، ئایا دووە یان سێ؟ نوێژی سێیەم فەرزە یان سوننەتە؟ رکوعی تیایە یان تیای نیە؟ چەند سوجدەی تیایە؟ چەند قورئانی تیا بخوێندرێ؟ بۆیە تەحەددایان دەکەین بە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرای قورئان چۆنیەتی ئەو نوێژە بسەلمێنن.

سەرەڕای ئەوەش هەر بە قورئان دەتوانین بیسەلمێنین رۆژانە پێنج نوێژ هەیە، جارێ پێش هەمووو شتێك دوو نوێژ بە روونی ناویان لە قورئاندا هاتووە کە نوێژی بەیانی و نوێژی عیشایە وەك لەو ئایەتەدا هاتووە [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ

الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ..] النور: ٥٨ ئایەتەکە باس لە پرس وەرگرتنی عەبد و جاریە و منداڵە بۆ چوونە ژوورەوە لە دایك و باوك لە سێ کات دووانیان لەوانە بریتیە لە پێش نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عیشا. کەواتە لێرە دوو نوێژ بە ئاشکرا ناویان هاتووە.

لە ئایەتی [حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَىٰ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ] البقرة: ٢٣٨ خوای گەورە فەرمانمان پێدەکا پارێزگاری بکەین لە (الصلوات) دیارە ئەو وشەیەش کۆی وشەی (الصلاة)، ئاشکراشە کەمترینی کۆ (جمع) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە سێ، کەواتە ئایەتەکە بەڵگەیەکی روونە لەسەر بوونی لایەنی کەم سێ نوێژ.

ئایەتی [وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ] هود: ١١٤ وشەی (طرفي) باس لە هەردوو سەری رۆژ دەکا، هەر چەندە زانایان بە نیوەڕۆ و عەسر راڤەیان کردووە بەڵام رەنگە رەخنە لەوە بگیرێ بوترێ سەری یەکەمی رۆژ بریتیە لە بەیانی نەك نیوەڕۆ، با ئێمە لەسەر ئەوە بڕۆین و بڵێین سەری یەکەمی رۆژ بریتیە لە بەیانی و دووەمی بریتیە لە کاتی عەسر تا پێش ئاوابوونی رۆژ، کەواتە لەمەوە دەگەینە ئەوەی نوێژێك هەیە لەکاتی عەسردا دەکرێ، پێشتریش وتمان هەردوو نوێژی بەیانی و عیشا بە ئاشکرا ناویان هاتووە، لەگەڵ نوێژی عەسر دەبێ بە سێ نوێژ.

ئینجا هەر لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ (وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ) (زلف) لە زمانی عەرەبی بەمانای نزیك دێ، کەواتە بەلای کەم نوێژێك هەیە لە شەودا دەکرێ لە کاتێکی نزیکی هەردوو سەرەکەی رۆژ، ئێمە ئەگەر تەنها کاتی مەغریب وەربگرین کە نزیکە لە رۆژ کەواتە نوێژەکان بوون بە چوار؛ بەیانی و عەسر و مەغریب و عیشا، جا لێرە با بگەڕێینەوە سەر ئایەتەکەی سوڕەتی بەقەڕە کە باسی نوێژی ناوەند (الصلاة الوسطى) دەکا، بوونی نوێژی ناوەند واتا دەبێ ناوەڕاست بێ نوێژێك لەپێشی هەبێ و نوێژێك لەپاشی هەبێ یان دوو لە پێشی و دوو لەپاشی، بەڵام ئێمە تا ئێستا سەلماندمان کە چوار نوێژ هەیە، جا پرسیار لێرە ئەوەیە: ئایا لە بوونی چوار نوێژدا نوێژی ناوەند کامەیە؟ بێگومان نوێژی ناوەند بوونی نابێ لەو حاڵەتەدا لەبەر ئەوەی دەبێ نوێژێك لە پێشی هەبێ و دووان لەپاشی هەبێ یان بەپێچەوانەوە دووان لە پێش هەبێ و یەکێك لە پاشی، ئەو کاتەش نابێتە نوێژی ناوەند، بۆیە هەر دەبێ پێنج نوێژ بێ تا دووان لە پێش بێ و دووان لە پاشی.

سەبارەت بە نوێژی پێنجەمیش با بچینە سەر ئایەتی [أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ] الإسراء: ٧٨ واتا نوێژ بکە لە کاتی (دلوك الشمس)، وشەی (دلوك) لە (دلك) هاتووە، ابن فارس دەڵێ: "الدَّالُ وَاللَّامُ وَالْكَافُ أَصْلٌ وَاحِدٌ يَدُلُّ عَلَى زَوَالِ شَيْءٍ عَنْ شَيْءٍ" کەواتە دلوك واتا زوال، بە کوردیەکەی واتا نەمان یا تێپەڕین یا جێهێشتن، کە دەفەرموێ دلوك الشمس واتا کاتێك خۆر نیوەی ئاسمان جێدەهێڵێ، دیارە ئەو کاتەش دەکاتە کاتی نوێژی نیوەڕۆ کە تیایدا خۆر نیوەی ئاسمان تێدەپەڕێنێ.

ئێستا ئەنجامەکە بەو شێوەیە بوو:

- ئایەتی ٥٨ی سوڕەتی نور بەڕوونی باسی هەردوو نوێژی بەیانی و عیشا دەکا.
-ئایەتی ٢٣٨ی بەقەڕە بە روونی دەیسەلمێنێ بەلای کەم سێ نوێژ هەیە لەبەر ئەوەی (صلوات) کۆیە و کەمترینی کۆش لەزمانی عەرەبی سێیە.

- ئایەتی ١١٤ی سوڕەتی هود باسی دوو نوێژ دەکا لە هەردوو سەرەکەی رۆژ ئەگەر یەکێکیان بەیانی بێ کە سەرێکی رۆژە ئەوا سەرەکەی تری رۆژ کاتی عەسرە کەواتە نوێژی عەسر یەکێکی ترە لە نوێژەکان.

-هەر لە ئایەتەکەی سورەتی هود باسی زلفا من اللیل دەکا واتا کاتێکی شەو کە نزیك بێ لە رۆژ ، ئەمەشیان نوێژی مەغریب.

- دوای ئەوەی بوو بە چوار نوێژ (بەیانی و عەسر و مەغریب و عیشا) وە ئایەتەکەی بەقەرە کە باسی نوێژی ناوەند دەکا ناوەندیش دەبێ ئەو سەر و ئەم سەری یەکسان بێ کەواتە نابێ چوار نوێژ بێ بەڵکو دەبێ پێنج بێ تا دووان لە پێشی بێ و دووان لە پاشی.

- نوێژی پێنجەمیش کە نیوەڕۆیە لە ئایەتی ٧٨ی سورەتی ئیسراو بە روونی کاتەکەی دیاری کراوە کە بریتیە لە دلوك الشمس واتا ئەو کاتەی خۆر تییایدا نیوەی ئاسمان جێدەهێڵێ.

بەم شێوەیە هەر بە خودی قورئان سەلماندمان پێنج نوێژ هەیە، بەو هیوایەی بەناو قورئانیەکان کە زۆر بانگەشەی تەدەببوڕ و وردبوونەوە لە قورئان دەکەن بەخۆیاندا بچنەوەو کەمێك بە تەدەببوڕەوە سەیری ئەو ئایەتانە بکەن.

## وەڵامی گروپی سێیەم:

گروپی سێیەم دەڵێن صەلات بە مانای نوێژ نایەت بەڵکو وشەی (صلاة) لە وشەی (صلة) هاتووە واتا پەیوەندی، کەواتە صەلات تەنها ئەوەیە مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ خوا ببەستێ بەوەی کاری چاکە بکا و یارمەتی هەژاران بدا یا زەردەخەنەیەك بکا بەڕووی کەسێك یا دەست بەسەر منداڵێکی بێ باوك دابهێنێ.. هتد ئەمانە هەمووی صەلاتن.

جارێ پێش هەموو شتێك پێویستە بزانین ئایا راستە صلاة لە صلة هاتووە؟

کێشەی بەناو قورئانیەکان ئەوەیە زۆر نەزانن بە زمانی عەرەبی و بێئاگان لە زانستەکانی عەرەبی و فەرهەنگەکان و مانای وشەکان، و هەر لە گۆترە بەئارەزووی خۆیان مانای وشەکان لێکدەدەنەوە بۆ گەیشتن بەو مانایەی کە دەیانەوێ، کاتێکیش ئێمە بەڵگە بە موعجەم و فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی دەهێنینەوە - کە ئەصڵی زمانی عەرەبین و وشە و دەستەواژە عەرەبیەکانیان و ماناکانیان لە خۆگرتووە بە پشت بەستن بە قورئان و شعری جاهیلی و حیکمەت و وتەی عەرەبەکان لە کۆندا - وەریناگرن و دەڵێن ئێمە مولزەم نین بەو فەرهەنگانە! ئیتر دیارە ئەوەی ئەوان لە گیرفانی خۆیان دەریدەهێنن باشترە لەوەی عەرەب خۆیان سەدان ساڵە لەسەری دەڕۆن!!!

وشەی (صلة) لە فعلی (وصل) هاتووە، کەچی وشەی (صلاة) لە (صلی) هاتووە کە ئەصڵەکەی بریتیە لە (صلو) بەڵام پیتی واو ئیبدال کراوە بۆ ئەلیف کە بابەتێکی زانستی صەرفە لە زمانی عەرەبی، لەسەر ئەصڵە واویەکەی ئەو فعلە زوبەیدی لە (تاج العروس) دەڵێ: "الصَّلاةَ واوِيَّةٌ مأْخوذَةٌ من صَلَّى إِذا دَعا."

سەبارەت بە (صلی) ابن فارس لە (مقاییس اللغه) دەڵێ: ""(صَلَى) الصَّادُ وَاللَّامُ وَالْحَرْفُ الْمُعْتَلُّ أَصْلَانِ: أَحَدُهُمَا النَّارُ وَمَا أَشْبَهَهَا مِنَ الْحُمَّى، وَالْآخِرُ جِنْسٌ مِنَ الْعِبَادَةِ" واتا ئەو سێ پیتە دوو ئەصڵی هەیە یەکێکیان بەمانای ئاگر دێ ئەوی تر جۆرێکی پەرستشە.

جەوهەری لە (صحاح) دەڵێ: "[صلا] الصلاة: الدعاء" صلاة لە زماندا واتا دوعا.

سەبارەت بە (وصل) ابن فارس دەڵێ: "الْوَاوُ وَالصَّادُ وَاللَّامُ: أَصْلٌ وَاحِدٌ يَدُلُّ عَلَى ضَمِّ شَيْءٍ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى يَعْلَقَهُ" واتا یەك ئەصڵی هەیە بەمانای گەیاندنی شتێك بە شتێکی تر دێ.

سەبارەت بەوەی (صلة) چاووگە (مصدر) و لە (وصل) وەرگیراوە جەوهەری دەڵێ: "[وصل] وصلت الشئ وصلاً وصلة"، ابن منقوریش لە (لسان) هەمان شت دەگوازێتەوە، رازی لە (مختار) دەڵێ: "وص ل: (وَصَلْتُ) الشَّيْءَ مِنْ بَابِ وَعَدَ وَ (صِلَةً) أَيْضًا."

کەواتە (صلة) چاووگی فعلی (وصل)یە، کەچی (صلاة) لە (صلی) یان (صلو) وەرگیراوە، جا بیهێنە پێش چاوت (وصل) لە کوێ و (صلو) لەکوێ؟؟!!! دوو وشەی زۆر جیاواز و دوو مانای دوور لەیەکتر کەچی بەناو قورئانیەکان تەنها بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەن لە نوێژ زمانی عەرەبی و فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی دەخەنە ژێر پێیان و هەر لە گیرفانی خۆیان مانا بۆ وشەکان دەتاشن!

هەر چەندە ئەوەی باسمان کرد لە رووی زمانەوانیەوە کە (صلاة) هیچ پەیوەندی بە (صلة) نیە کافیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بۆچوونە سەقەتە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا دێینە سەر هەندێك ئایەت و ئەو جارە هەر بە قورئان ئەو بۆچونە دەخەینە ژێر پرسیار.

ئەوان دەڵێن صەلات واتا پەیوەندی بەوەی بە گشتی کاری چاکە ئەنجام بدەی، ئەگەر بچینە سەر ئایەتی ١٧٧ی سورەتی بەقەرە کە دەفەرموێ [لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ۖ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ] تیایدا خوای گەورە باس لە چەند جۆرێکی چاکە دەکا کە بریتین لە: باوەر بە خودا و رۆژی دوایی و فریشتە و کتێبەکان و پێغەمبەران و ماڵ بەخشین بە خزم و بێباوك و هەژار و رێبواران و داواکاران و لەپێناو ئازادکردنی کۆیلە، ئینجا دەفەرموێ (وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ) صەلات بکات و زەکات بدات، پاشان بەردەوام دەبێ لە ژماردنی چاکەکان و باسی وەفاداری بە پەیمان و ئارامگری دەکا.. پرسیار لێرە ئەوەیە: ئەو چاکە و سیفاتە باشانەی لەو ئایەتەدا خوای گەورە باسیان دەکا بەو مانایەی بەناو قورئانیەکان لێکیدەدەنەوە صەلاتە یان نا؟؟ ئەگەر بڵێن صەلات نیە ئیتر نازانین ئەو چاکانە صەلات نەبێ ئەدی چی صەلاتە و ئێوە مەبەستتان چ چاکەیەکە؟؟ ئەگەر بشڵێن صەلاتە ئەوا ئەو زیادەیە چیە لە قورئان کاتێك باسی چاکەکان دەکا پاشان لەنێوانیاندا صەلات جیادەکاتەوە کە ئەویش هەر ئەنجامدانی چاکەیە ئینجا دووبارە دەگەرێتەو سەر باسی چاکەی تر؟؟!! قورئان کە لە لوتکەی فەصاحەت و رەوانبێژیدایە ئەو شێوازە ناخۆشە و ئەو دووبارەکردنەوە بێ مانایە چیە تێیدایە؟؟!! قەت لەسەر ئەو ئایەتە نەوەستاون؟؟ خۆزگە دەمانزانی بە چ شێوەیەك مانای ئایەتەکە بەلارێدا دەبەن وەك نەریتی بەردەوامی خۆیان لە تەحریف و شێواندنی ماناکانی قورئان.

ئایەتی ٨٣ی بەقەرە بەهەمان شێوە باسی هەندێ چاکەی تر دەکا لەوانە بەیەکزانینی خوا لە عیبادەت و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و خزم و بێ باوك و گوفتاری جوان لەگەڵ خەڵك ئینجا دەچێتە سەر صەلات [وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ] سەیرە لەم دوو ئایەتەدا باسی ئەو هەموو جۆرەی چاکە بکا ئینجا دووبارە بچێتەوە سەر باسی چاکە بەوەی صەلات بکەن!!!

ئایەتی ٤٣ی سورەتی نساء دەفەرموێ [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا] دیارە سەرەتا دەڵێ نزیکی صەلات

مەکەونەوە لە کاتی سەرخۆشی تا نەزانن چی دەڵێن، هەروەها نزیکی مەکەونەوە ئەگەر جەنابەتتان لەسەر بوو تا خۆتان نەشۆن، پرسیار لێرە ئەوەیە چاکە کردن ئەوەی بۆ چیە جەنابەتم لەسەر بێ یان نا؟ کەسێك جەنابەتی لەسەر بێ ناتوانێ چاکە بکا تا خۆی نەشوا؟؟!!!! ئینجا لەوە خۆشتر ئایەتەکە دەڵێ ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەر سەفەر بوون یان جەنابەتتان لەسەر بوو ئاوتان دەست نەکەوت تەیەمموم بکەن و دەست بە خۆڵێکی پاك بگەیەنن، باشە ئەگەر یەکێك نەخۆش بوو یا لە سەفەر بوو یان جەنابەتی لەسەر بوو ئاوی دەستنەکەوت ئایا ناتوانێ چاکە بکا؟؟ چاکەکردن خۆشووشتنی بۆ چیە؟؟!!! پاشان ئەوەم پێ بڵێن ئەگەر ئاوی دەستنەکەوت بۆ دەست بە خۆڵ بگەیەنێ؟؟!!! چاکەکردن دەست بەخۆڵ گەیاندنی بۆ چیە لەڕێی خوا؟؟!!!!

ئایەتی ٦ی سورەتی مائدة بەهەمان شێوە باسی تەیەموم دەکا پێش ئەویش فەرمان دەکا بە دەستنوێژ [يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ] بەس پێم بڵێن چاکەکردن دەستنوێژی بۆ چیە؟! من بمەوێ چاکەیەك بکەم تا دەست و دەم و چاو و پێم نەشۆم ناتوانم بیکەم؟؟ وە ئەگەر ئاو نەبوو ناتوانم چاکە بکەم تا دەست بە تۆز و خۆڵ نەگەیەنم بۆ دەم و چاو دەستم؟؟!! ئەوە کێشەیەکی زۆر گەورەیە بۆ ئەو کەسانە دەبێ بۆمانی حەل بکەن بزانین چ پەیوەندیەك هەیە لەنێوان چاکە و دەستنوێژ و تەیەموم.

ئایەتی ١٠١ی سورەتی نساء [وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ] دەفەرموێ ئەگەر چوون بۆ سەفەر گوناهتان لەسەر نیە صەلات کورت بکەنەوە، پرسیار لێرە ئەوەیە: چۆن لە کاری چاکە کورت بکەینەوە؟ کورتکردنەوەی کاری چاکە چۆنە پێمان بڵێن؟ ئەگەر ئەمە باسی نوێژ نەبێ باسی چیە؟

ئایەتی ١١٤ی هود [وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ] کە فەرمان دەکا بە صەلات لە هەردوو سەرەکەی ڕۆژ و چەند کاتێکی شەو، ئایا چاکەکردن دیاریکردنی کاتی بۆ چیە؟؟ بە ڕۆژ ئەگەر لەهەردوو سەرەکەی نەبێ ناتوانم چاکە بکەم؟؟

ئایەتی ١١٠ی ئیسراء [وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا] کە دەفەرموێ لەکاتی صەلات دەنگ زۆر بەرز مەکەوە زۆریش نزمی مەکە، نازانم ئەوە لە کوێی چاکەکردن جێی دەبێتەوە؟!

ئەمانە و چەندین ئایەتی تر هەن لەبەر زیاتر درێژنەبوونەوەی بابەتەکە نایخەینەڕوو کە پرسیارگەلێکن ئەو تێگەیشتنە ناماقوڵە بۆ صەلات هەڵدەوشێنێتەوە.

لە کۆتاییشدا پێویستە بڵێین ئێمەش ناڵێین لە هەموو شوێنێك صەلات و موشتەقاتەکانی بە مانای نوێژ دێت، لە هەندێ شوێن بە مانای تر دێت کە ئەوە دەچێتە بابی زانستی (الوجوه والنظائر) پێشتر لە بابەتێکدا باسمان کردووە دەتوانن لەو لینکە سەیری بکەن: https://www.facebook.com/gwman.walam/posts/1638459649781969:0